**ناوی کتێب :** بەفرانباری 23 ساڵ

**بابەت :** شێعر

**نووسەر :** جەماڵ نەجاری

**پێت چن :** هونەر مەولوود بەحەرکەیی

**تیراژ :** 1000

**دیزاینی بەرگ :** ئاسۆ مام زادە

**چاپی یەکەم :** 2005

**پێشکەش بەو :**

**قەسیدە درێژە خەمناکە**

**دایکم ( فاتمە زەندەش ) و چاوە بارانییەکانی**

**بۆ« هۆگر » و « پەپولە »**

**کە ئەویندارى راستەقینەى یەکن.**

# شێعرێك له دیوانی گیرفاندا

## سكالاٚ

ئای سه‌یر كه‌ن ، سه‌یر

ئه‌م هه‌رێمه‌ كپ و ماته‌ و هاوار ؟

بێده‌نگی خه‌ون و تارمایی ئه‌شق / تێكه‌ڵ / ؟

له‌م شه‌وه‌ خولیا شینه‌دا

من له‌تێك له‌ سیمای خه‌یاڵی / نون / دال / ئه‌لف /

له‌گه‌ڵ ،

﴿ كوردستان ئه‌ی نیشتمانم ﴾

به‌ دیواری ژووری مێشكم هه‌ڵواسیوه

تا ئاسمان ئاشقانه‌ سه‌یر كا / وه‌ك ئێوه /

خه‌زه‌ڵوه‌ری هۆنراوه‌ی په‌پووله‌ و

هه‌ڵفڕینی رۆح تا ئه‌به‌دییه‌تی خۆم

وشه‌ باران

/ هه‌ر لێره‌وه‌ /

تا ،

دووهه‌زاریترین ته‌مه‌نی خۆم ،

/ باران /

/ وشه‌ / و

خشپه‌ی مه‌رگ

له‌ ولاٚتی بێ سنووری بێخۆییم دا ،

خه‌و ده‌بینم

/ خه‌ونی دره‌خت / خه‌ونی هه‌تاو / خه‌ونی خوێن / و

جاده‌ و چرا

ئێمه‌ كاتی پشكوتنی گوڵمان وه‌ری

/ په‌نجه‌كان /

سه‌رده‌مێكه‌ بێ پرسیارانه‌ پێم ئه‌ڵێن : ﴿ هێزی دڵ ئارامی گیانم ﴾

تا ئه‌و په‌ڕی دڵدارییه‌كان

/ بێ شه‌رمانه‌ /

هه‌زار ژوان

به‌ سلاٚوێك ـ له‌ڕه‌نگی ماچ ـ ناگۆڕنه‌وه‌ . . .

ئای

له تاوانە پەپوولە بوون

له زەریایەکی نامۆدا

وشە و ماسی

باڵ لێ ئەدەن / تەڕ /

له ئاسمانی شاعیرێکی بێ شەقام و خۆشەویستی ،

جگەرەیەك

تا ئەو پەڕی نازانم چەند ! ؟

له خۆم کێشان

له کەس گەڕان

/ بە دەم شنەی شەماڵ ، شەکەت /

چ بڕیارێکی نا حەزە / دژوار /

تا زە بوونە رابووردی یاد

تا بەهارە و ئێوارانی پێکەوە بوون

ساعەت پێنج و چەن دەقیقە

تا دەبێتە سنەوبرێکی ئاشق

﴿ جێی سەر بڵێندی و شانازی ﴾

منیش باران دەبارێنم

/ شەیپدا /

یا نا شەوێك ، ڕەنگە بڕۆم ـ بە نیگاتا ـ

بە چرای مانگ

بچمە سەرێ و

خۆم بە قژتا ـ ئەستێرانە ـ هەڵدەواسم ،

بیر لە تۆ و لەو ئاسمانەی خۆشمان دەویست

هەنگاو ، هەنگاو

/ چاوەڕێتم /

ڕەنگە مەرگ ...

هەتا شوێنی تەنیایی / خۆم /

هەتا چاوی بێدەنگیم / کوێر /

مەترسی بوو

خەمێك لە کۆڵ ، بە شان بردن

تا ئێستای چرکە چرکی کاتژمێر و

نەهاتنت

تا ئێستای لەگەڵ خۆم بوون

﴿ تا دڵ دەخوازێ دڵخوازی ﴾

لە گەڕانی نێوان شەقامی بێ ناوی

نە تۆ تێیدا مردی ، نە من ،

تا بەرزایی چیاکانی ئەفسانەیی و

خولیای (( گریلا )) بوون

نیوە شەوێك

وەك تا لە خۆم یاخی دەبم

/ ڕێگە دەبڕم /

بە چرای مانگ

بەر لە کۆچی ئەستێرە و / چۆن / ؟

(( مێشکم ، هەستم ، بیرم ، ژینم ))

ئازادی و خوێن

سیاسەت و ئەشق

/ دەبێ و نابێ /

تا گەڕان لە دەماری ئەمجارەی تەنیایی ئاوێنە دا ،

تا ،

(( کاغەزێ دەنووسم بۆ لەیلا )) یەکێتر

ئەشق ئەسپێکی سەر کەشە و

یاخی .

(( نوون ))

لە کوێی ئەم شێعرە جێ ماوی

/ نیگەران /

(( دال ))

باس لە تووانەوە مەکە / دڵۆپ ، دڵۆپ /

(( ئەلف ))

ڕەنگە سەرەتایەك بۆ دیوانی شێعری خودا و

{ لام ـ میم }

لەوانەیە مەرگ بێ ، کۆتایی تامەکانی تەنیایی و

خاکە لێوەی ماچەکان .

گەر بێیەوە

لێوێکت پێدەبەخشم / تا چرۆدا /

بێدەنگی ـ مان

وەسییەت بێ

(( بۆ تۆن ئەی گیانی شیرینم ))

/ و شـ ـە کـ ـا نـ ـم /

بۆکان ـ پاییزی 1378 هەتاوی

# لە درێژترین نووسراوەدا ونت دەکەم

بەشوێنتا ئەگەڕێمەوە

لەسەرەتای گەڕانەوەی تەواو بوون دا

سوور ، سوور ، / شەهیدانە /

تا لە ناو تەنیاترین ڕۆباری شار ون بم

لەت لەت

من لە وەرزێكی تەڕی بێ باران وەك یەحیا : (( لە دایك مردم ))

ئێستاش ئاشقم ، شێت

بە زەریا و ئاوەدانی ئەم كەویرە بێ باوەشە .

} سەد ئەوەندەی كوێری لە چاوم دوورە ( تۆ )

نزیكی لە (من )

وەك داهاتوویێكی دوور ،

زۆر دوور تر لە ئێستای سبەینێ {

جگەرەیەك ئەكێشمەوە

تابلۆیەك ئەسووتێنم

ژیان ـ مان ـــ زەرد

پاییز ـ من ـ تاڵ

تاڵە گەیشتن و بڕان .

چ خەونێكە ، نووسین

و

ە

ر

ی

ن .

ئەگەڕێمەوە بە دووتا ،

تا ون ئەبم لە پەیدا بوونێكی هەمیشەیی ،

/ وێڵ وێڵ /

نازانم بنووسم بە زار ـ چۆن ـ

تا خۆشەویستی } تۆ ـ من ـ مان {

بە نێوان دووكەڵ و ماشێن ، بگاتە ئەم بەری شەقام .

كە ( ......... ) لە تۆ و لە هەناسە .

هـ ـا و ا ر

لێرەوە مەودا تا ئاشق بوون / لە نەبوون را /

باس لە مردن كردن ـ ژیان ـ

} من دەمهەوێ {

دوێنێ لەناو ڕۆبایێكا تۆم دیتەوە ، ونم كردی / پڕ /

ویستم ڕاوە ستم ، ڕۆیشتم

ڕۆیشتم تا راوەستانێك لە بیر بەرمەوە / خۆم /

دوێنێ و ئەمڕۆی نامەكانت ،

چاوەکانت

لە غووربەتا ئاشنا بوون

} پارە شیرین ترین ماچە {

ئێستا چاوی تۆ ،

حەزیان لە گورگە و لە خوێن ،

ڕقیان لە ماچە و لە ماسی .

ئای لە تەعبیری ئەمجارەی خەوەکانت

/ ورد ، ورد / سووتان

سووتان و جگەرەیەك لە قەراخ ڕۆباری تەنیای ئەم شارە . . .

هاوڕێیان وێڵ بە دووی هیچ تا هیچ

هەتاو سەرما بردووتر / لە من /

رادەسپێکردنە ەێستان .

دەست ئەخەمە ناو گوێچکەم .

گیرفانم پڕ ئەکەم لە وشەی قاوەیی کاڵ

تا ئاسمان چڕۆدا

/ ئەمجارە /

ببێتە کەویری بێ باوەش ـ لە درەخت ـ

لە کۆچ دا

مەودایەك پێکەوە ین ،

} من و من {

تا دیتنەوەەیەکی تر ، گەڕان ،

نازانم تێر ئاوی کام شەقام بم

شەقامی (ژ)

شەقامی ( کاف )

لە رۆباری ئەم شارە زۆری بابۆڵە کێشاوە

/ من /

سەرمای ئاگری ئەوینی ڕەش ،

کلوو ، کلوو.

تۆ ؟

لە ناو بسکی ئاڵۆزی زستانێکی گوڵ گوڵی دا ـ بەرەبەیان ـ

یاری ئەکەی و مەرگیش .

درەختەکان

/ تاوەرین / ڕێ نەماوە ـ بریا ـ خۆزگەـ

تۆ و تەمەننا لە سات بۆ مەرگ

من له سنوور تا پارەی نان و نەوت .
ئای چ دیلانێكە ، گریان
چۆپی ئەكێشێ چارەنووس ـ مانـ
له حەسرەتی بیستنی وتەكانی ناو تەلەفوون
بێزارم / له خۆرِا /
له كوێوە دووبارە سەرەتا بینەوە
بە داگیرسانی ئەمجارە مەرگێكی سووتاوت ئەنووسم .
له تۆ ڕا دێمەوە
تا ئەگەم بە ( من )
منی وێڵ له خەون و پەپوولە و خۆم
شێتی ئاقڵ بوونی (( مۆدێرنم ))
وەك خۆم ئەتۆ ئەپەرستم .
وەك ئەتۆ خۆم ئەكووژم
ئەچمە سەر بە ناخی ئازاری ژنانە / بە ناختا /
ڕۆ دەچمە بە لووتكەی بەرزی پیاو بوون / بە هیچ دا /
شێتانە ئا قڵ ئەبم ،
تا گیرفان له گوێچكە وو له دەست
/ خەڵوەت /
نا تكووژم ، ئاشقم
لەبەرەبەیانی ئێوارەیەك دا دێمەوە
بە دەستی له ئەسرین (...)
بە چاوی له هەنار / پڕ /
دەنك ،
دەنك ،
بەتامی تۆوە من دەبینم
بە تۆوە منێكی خۆشەویست دەخوڵقێ .
ژینێكی پڕ وەڵام
/ هەمووتان /
پرسیاران چ سەختە .
نەنووسراوانەی ئەنووسم
تا ئەتۆم لەگەڵ بێ ،
تەنیایی تا باران .
پڕ دەبێ بێدەنگیم ،
له دڵتەنگ بوونێكی نوێ .

زەردایی بەهارە پاییزێك

(2) چرکە و تەنیایی

من لە ژین دا مردن / دەبارێم /

تۆ لە مەرگ دا ژیان / دەوەری /

خەونەکان بەخەبەر

تا ئێستای وەرزی ماچ تەمەنم درێژە ......

سەفەری ئاوێنە ، تۆزاوی

منیش مەست / لە خەون و لە خولیا .

هەر دەرۆم دێمەوە

تا ،

(( دەستی ماندووت پڕ بکەی لە سەوزەڵانی ))

بە خولیای خەوێچکی خەواڵوو ، چوونەوە

لە نووسین یاخی بوون ،

(( بوون )) یاخی لە نووسین .

مردن ،

مەرگ ،

ـ تا بلۆیەکی نەخشبنەی ، ژین ـ

بۆکان ـ 1380 هەتاوی ـ

## کارەسات

زەوی ،

گڕ دەسووتێ بە دەوری هەتاو و

ئەمشەوە تا سبەی

باڵ دەگرێ هەستێکی بەتین و سەفەری وشەیە تا مردن .

دڵپڕە ، شەقامی بێدەنگی

ـ تا سبەی ـ

ئەم ئاوی ئاسمان

خوێناوی ، دەروونم

بە هەزار ئەستێرە و مانگەشەو

/ خەوم ـ نا /

چ ساردە ، ئەم ژوورە

ـ زستانە ـ

ئەیبەستێ لە سەرما ، هەناسە

چ گەرمە ، دەروونم

ـ هاوینە ـ

وەکوو خوێن کە گەرمە

ئەنووسێ ئاهەنگێ بە نۆتی کرێوە تا ...... بەهار

نازانن !

ئەسووتێ زەوی وە ك پەپوولە ؟

/ ئەزانم /

نازانن ، هەتاویش (.........) ؟

/ ئەزانم /

شەقام ؛ چۆڵ

چ خۆشە بۆ ژوان ئەمشەوە

نەبە فر ئەبارێ ، نە ......

ــ بەسە بەس ، خەیاڵە .

ئەم شەو چ ساردە، ژوورەکەم

} تەنافی هەڵواسراو {

بیر ئاڵۆز

چەقۆیە قەڵەم

سەر دەبڕێ ، سەری شێعر

دڵنیام ، دەبێتە کارەسات / بەیانی /

زیندانی ئازارە ـ ئەم ژوورە .

زستانی مەرگ و خوێن ـ ئەمشەو

} بیر ئاڵۆز

چاو برسی

ـ وەکوو سەگ ـ

تاوانبا کێیە ؟

من ؟

قەڵەم؟ }

چ سەختە

ئەمشەوە بێ ژنە ،

بە تەنیا گوناهبار .

بێ خەو و بێ باوەش

/ نا ـ خەوم ـ نا /

دەرەوە نابینم

پەنجەرە هەڵماوی هەناسە ،

لێو بە لێو ،

ئەسووتێم بە ماچێك

ـ بەسە بەس ـ خەیاڵە ـ دووبارە .

کەی دەبێ ئەمشەوە بێ تەواو

{ کۆتایی } !!

ئامێزم پڕە لە بێ تۆیی

بە نەبوون وەرە لام

/ چاوەکەم /

چۆنە چۆن ؟ !

نازانم خەیانەت بە وەڵڵا .

بۆ دەکەن نەفرینم ـ وەك شەیتان

/ ـ تا سبەی ـ /

چ سەختە ئەمشەو ، بە تەنیا .

وانەبووم / هەمیشە /

دەبووین جووت پێکەوە

ئەوێستاین

بەرابەر پەنجەرە

ئەچۆ دەر نیگامان تا شەقام

( ئاخ )

ژوانی نیگاکان ، چ خۆشە

رەنگ زەرد من

گۆنا سوور ، ئەتۆ بووی .

هەناسە تێکەڵ بوون

/ لەگەڵ تۆ /

{ چ قورسە نیگاکەت

/ ناتوانم /

چ سووكو ئەندامت

/ بە وشە یاخی بم / {

دێمەوە

تا خەوی ئاڵۆزی بەدی دێ ،

شاعیرێك ،

/ ـ تا سبەی ـ /

ئەم ژوورە هێلانەی لەزەتە ؛

لە زەتی چاوی من ،

مەمكی تۆ ،

تا سەحەر ، چ خۆشە (( سەحەر ))

بێ تۆ ، بوون ،

چ ناخۆش .

ببورە ئەمشەو ئەروانم بۆ شێعری شاعیرێ

جێت دێڵم ،

بۆ ساتێ ،

/ نا چارم /

چەن سەعەت ؟

/ نازانم /

كاتژمێر خەوتووە

ـ ئەیبینم ـ

چ گەرم بوو , ئەم شێعرە

{ (( دایگیر ساند لە دەروون , ئاگرێك ★)) }

درەنگە شەو ،

نابێ لە دایك

ئەم هەستە سەر شیچتەم

وەك جاران رووت ئەبم

بەرانبەر ئاوێنە

ئەروانی مانگ لە من

لەو بەری پەنجەرە ،

شەرم ئەكا وێنەی ناو ئاوێنە

ئەپۆشێ لەشی خۆی بە مەیلم

سێڵاوی فرمێسك دێتە خـ

و

ا

ر

له چاوی .

مانگ له من ئەڕوانیٚ و

من له ئەو ... ؟

ـ بەسە بەس ، بیٚ شەرمی هەتا کەی ؟ !

ـ چت ئەویٚ له ژیان ،

تەمەن کورت ؟

/ خالّییە جانتاکەت /

ـ سویٚند ئەخۆم    بە هەزار ئاویٚنەی شەر میٚون !

به هەزار پەپوولە ئەستیٚرە!

به هەزار تاوانی بیٚ تاوان !

به ( یەك ) ماچ !

دوایی دیٚ ئەمشەوە

گولّ دەکا دار بەڕوو

به ریٚژنەی بارانی داهاتوو .

گڕ ئەدەم ؛ زستانی مەرگ و خویٚن .

گەرم ئەبم به تینی خاك و خۆلّ ،

هەلّ ئەمژم ؛ شنەی با و رۆباری هەناسە .

بۆن ئەکەم ؛ شکۆفە و مرۆڤ وباخی بوون

ئەسووتیٚم ؛ بە چەشنی ئاگرو ئەوین و گوناهی

شەوانە و تەنیایی و ژیلە مۆ !

ئەبیستم ؛ هاواری کەمانچە و گریانی شەقام و جریوەی چۆلەکە

ئەخویٚنم ؛ چریکەی یەخسیری ناو قەفەس بە کاتی ئیٚوارە .

ئەنووسم ؛ لەسەر بەرد ـ لەسەر کیٚلّ ـ لەسەر دلّ

به چەشنی ڕەشە با ـ میٚژوی خۆم

/ ئاخ له خۆم /

دریٚژە ئەمشەوە و

کۆتایی کەنگیٚیە ؟

/ نازانم / !

کاتژمیٚر مردووە

ئەبینم ناکیٚشی هەناسە ،

} له شەقام کوندە بوو {

دامدەگرێ مەترسی ...
( تاریکی و تەناف و تەنیایی )
( ئاخ )
خۆزگە تەوتو بێ ئەمشەوە و
تەواو بم .
ر
سە
چمە
ئە
لە مردن نزیکم ـ چەن ساتێ !
ـ نا توانن بمکوژن ، نە خەنجەر ، نەتفەنگ ،
/ سبەینێ /
ئەترسێم سەر ببڕن لە جیلت مە ـن
ئەم شـ ـێعرە
ـ بەسە بەس،
ئاوا چارەنووس
تەواو بوو
خەیاڵ و ئەمشەوە
ماڵ ئاوا .
بۆکان ـ 79ی هەتاوی

# بۆو کەسانەی ئەمناسن و نایانناسم

( ئاسمان ،
شەو
تارمایی ،
خەو )
لە گرمەی خەوێکی شەکەت راپەڕیوم .

چاوەکانم ،
گێرۆدەی نەخەوتنی شەوانی پڕ ئەشکی چاوەڕوانین
دڵ ،
کانیاوی خوێن .
هەر چوار دەورم ، تەڕ و تاریك .
بیرم لەسەر لووتکەی خەیاڵ
لە مەڵبەندی بێ قەراریم
وەك باڵندەیەکی کۆچەری
بەرەو شاری گزنگ ئەفڕێ .
دەم و بەیانی ئەتبینم
زەردەخەنەی سەر لێوانت هێشتا چرۆی نە کردووە .
بۆیە هەموو ماچەکانمان
ناکام ئەبن و ناگەنە لێو .
چاوەکانت
ڕۆژانی سەخت و ساردی ساڵانی فرمێسك و گریانیان لە بیرە
فرمێسکەکانت هەڵئەمژم .
من ، پڕ بە ناخی ساڵانی تەنیایی و تێنوێتی ،
چۆڕاوگەی فرمێسکی روونت ئەبێتە شۆڕە بی
نێرگزی خەم لە لێواری شۆڕ بۆتەوە .
لەگەڵ یەکەمین گزنگا ،چاوەڕوانم .
چاوەڕوانم ،
وێنەم لە ئاوێنەی تەم گرتوودا بەدی بکرێ.
ئەمجارە وێنەم لە خۆم ناچێ !!
من منالّی خوێن و بەفرم
وێنەم منالّێکی هەتیو ،
من هاوڕێی کرێوە و لێزمەی بارانم
وێنەم هاوڕێی سێدارە و کێو ،
من شەپۆلی دەریای شێعرێکی پەژا رەم
وێنەم شەپۆلّی دەریای نامۆیی ،
دەستەکانم بۆنی خەم و گریانی لێ دێ
دەستەکانی بۆنی عەترو مێخەك .
من لەگەڵ خەم دا راهاتووم
بەلاّم وێنەم
لەگەڵ ترس و دوو دلّی دا .

وا حەز ئەكەم ، هەموو چەقۆكانی ئەم جیهانە زگم ئەدڕن
هەموو بزمارە ژەنگاوییەكان ، كاسەی سەرم كون ئەكە ن
گشت تەورو داسەكان ،
دەستو لاقم دەئەنجنن
ئەو كەسانەی ئەمناسن و نایانناسم ، پۆ لوو لو چاوم رائەكەن .
لە ئاگری نەفرەتیان دا
جەستەی ماندووم ئەسووتێنن
لەئاكام دا
وشەی ساوای شێعرەكانم ، بەرەبەیان
لە دار ئەدرێن .
بەلاّم وێنەم ،
وێنەی نامۆم ،
دلگیر مەبە ، دلّچم بۆتە گۆڕستانی بیرەوەریت
چاوەڕێ بە .
چاوەڕوانیت شاعیرێچكی بێ قەرارە ،
لەناو دلّی ئاوێنەیەكی تۆزاوی دا
شێعر دەنووسێ
{ بۆ تەنیایی و بۆ بێ دایكی و بێ ولاّتی }
ئەم وەرزە ، وەرزی بووژانەوەی كنیاوی بیر و باوەڕە
داری باوەڕ ، چرۆ دەدا
تا دەبێتە گولّی هیوا و سەربەخۆیی .
ئەو كاروانە ، بە هەورازی ئەو شەوەدا سەر دەكەوێ .

ئاسمان ، تریفەی مانگ و ئەستێرەی
بە قژی هەلّواسیوە .
لە دوورەوە ، كوندە بوویەك
پەیتا ، پەیتا
ئەم گۆڕانی خۆلّەمێشی یە ، دووپات ئەكا .
بڕیار وایە ئەمشەو ،
وێنەیەكی ناو ئاوێنەی خەم لێ نیشتوو
لە سێبەری ڕەشی خەونێك لە دار بدرێ
( ڕووداوێكی دلّتەزێنە )

بەیانییە و
روخسارەکان ، لە چوار چێوەی ئاوێنەیەکی شڵەژاو دا جێ گیر دەبن .
وا حەز ئەکەم ، وێنەی ئێوە ، وێنەی منە
دەسا وەرن ، بە تێکڕایی
وێنەم لە قاپی دڵ بگرن .

بۆکان – 20 ی سەرماوەز 2700 کوردی

## (( بەفرانباری23ساڵ ))

ئەو خەمانەی لەگەڵ منا باڵا دەکەن
لەسەر زینی ئەسپی خەیاڵ دائەنیشم

ئەفرِم بە شوێن ،
(( باران وبا ))
سەردەمێکە لەناو جانتای ئەندێشەم دا
ونم کردوون : (( باران و با ))
هیچ ڕێبوار و هیچ درەختێك نا دۆزمەوە
باڵا بەرز
پێ بە هاواریان بزانێ
لە ئێستگەکانی هەور و ئەشکەوتا
چاوەڕوانم
ناو نیشانتان بە جێ بێڵن
(( باران وبا ))
ئازارێکی چەندین ساڵەم !!
باش نازانم
لەگەڵ کلۆ بەفری سپی کەو تمە خوارێ و
بوومە زستان ،
یا لە نێوان ئاگر و تینی و هاوین و
هەڵقرچانی هەتوانێکا
بوومە گریان .
باش نازانم
خوا دەیزانی ، باش نازانم !!
ئێستا دڵم ،
درەختێکی بێ قەرارە ،
بەجێ ماوە لە دارستان ،
بەجێ ماوە لە ئاواز و شێعرو پەخشان
پیرە پاییز ،
هێدی هێدی ، گەڵاکانمی هەموو وەراند
کزە بایەك بردیە ماڵە کچە شاعیرێك و
شێعرەکانی تیا نووسی ـ بۆ یادگار ـ
ئێوارە یە
ئێوارەیەکی پاییزی
جێ ژوان چۆڵە ،
نەباران ئەبارێ ، نە ماچ ،
نە گەڵا تەڕ دەبێ ، نە لێوی تۆ
ئەرێ تۆ ، تۆی خۆشەویست .

تۆ نازانی ،
له دوای کۆچت  دەستی هیچ درەختێکم نەگوشیوە .
سەرم نەخستە سەر شانی هیچ چیایەکی باڵا بەرزو
دەست ناخەمە ملی شەوو
شانە ناکەم بسکەکانم .
هەموو شەوێ ،
تراژیدی خەونەکانم دووپات ئەبێ و
خەو ئەبینم ،
لەشم ئەکەن بە دوو بەش و
هەمو لەشم هاوار ئەکا : من (( عیسا )) نیم .
له جیاتی خاچ
بە منارەی مزگەوتێکا ، هەڵئەواسرێم .
باوکم دێت و تفەنگێك و ......
تەقەیەك و دووان و سیان و ئیتر تەواو ...
حەیرانە ، حەیرانە ، حەیران .
حەیرانێکی تەمەن کوورتم .
من له ناخی ئەو ئاوازەدا ژیام .

(( ئازیز ، سەری من ئێشی ، دڵی منی ماڵ وێرانی ، چەندی دەکاتەوە
ژانی ، ئاورێکم بەر بۆتەوە دەروونی . بڵێسەم پەرپوەتەوە دەروون
خانێ ، نە بە بای دەکوژێتەوە ، نە بە نمە نمەی بارانێ ))
حەیرانە , حەیرانە , حەیران .
حەیرانێکی تەمەن کورتم .
کەچی باڵای خەمەکانم هێندە بەرزە ،
سەری ئەگاتە ئاسمان .
ئازارێکی چەندین ساڵم !!
له ئاسمانی چاوی لێڵی (( دیار بەکر )) دا دەبارێم ،
دەبمە فرمێسك .
له گرمەی خەوی مناڵێکی  (( هەڵەبجە )) دا رادەچەنم
دەبمە هەنسك .
لەناو گەرووی پڕ زوو خاوی (( مەهاباد )) دا رادەپەڕم
دەبمە هاوار؛
لەسەر شاخی (( ناڵە شکێنە )) دائەنیشم و
دەبمە (( حەسەن )) ،

هەر چرکەیەك ئاوازی نوێ ئەخوێنم
نوێتر لە ڕۆژی رابردوو .
فرمێسك ،
هەنسك ،
هاوار ،
حەسەن ،
بەبێ ئێوە ، ساتێ ناژیم ،
بەبێ ئێوە ، هەر ساتێکم مردنێکە .
من ، باڵوێزی سەرزەمینی ئەرخەوان بووم
بەڵام ئێستا ،
منالێکم ، کاتچمێری ون کردووە ،
مەلێکم ، باڵی بەخشیوە ،
ڕۆبارێکم ، ڕاوەستاوە ,
ئاوازێکم , نەبیستراوە ,
روو ئەکەمە هەر شوێنێکی ئەم جیهانە وێرلنەیە
منالەکان تاوانبارن .
لە بەهاری تەمەنیاندا
لە جیات باران ،
گولله دەبارێ و
لە جیاتی ماچ ، پەنجەیبڕین
لەسەر رووەمەتیان دا دیارە .
سێ منالی پاڵ بە دیوار ......
تەقەیەك و دووان وسیان و ئیتر تەواو ...
مێژوو کوێرە , کەڕە
هیچ نابینێ ، هیچ نابیستێ ،
ژیان مەرگە ،
لێرەو لەوێی ئەم جیهانە وێرانەیە .
شانۆیەکی دڵتەزێنەو
ئەکتێرەکان ، دەسوتێن و دەتوێنەوە .
(( فەرمانە ، فەرمانە، فەرمان ))
ئاخ ، ئەترسم لە فەرمانی ئەمجارەتان ،
(( ئاراڕات )) ی گڕ و خوێنم ، شۆڕە سوارێکی غەیبەو
لەهیچ وڵاتێ رایناگرن .
(( زرێبار ))م گۆمی زامەو

هەزار مەلی تیا خنکاوە .

پیرە (( هەلێر )) بەسەر هاتی کۆرپەکانی دەگێڕاوە .

(( ئار بابا)) ی گەنج

لێوی تەڕە بۆ مژینی گۆنای هەتاو .

ئاخ , فەرمانە، فەمانە ، فەرمان .

لرفەی تفەنگ بەرز دەبێ و ....

تەقەیەك و دووان و سیان ئیتر تەواو ...

ئازارێکی چەندین ساڵەم !!

چاوەکانم شاری خەمن

لەجیات باران ئاگری تیا ئەبارێ و

دارستانی خۆشەویستیم ئەسووتێنێ

مێشکم : پایتەخی ئازارو خەم !!

شاری 40 میلیۆن وشەیە / هەر وشەیەك منالێکە و/ هەر منالێك شاعیرێکە و /

هەر شاعیرێ ،

شەهیدێکە و / هەر شەهیدێ

پەپوولەیە سەفەر دەکا بۆ هەرێمی هەور وباران

دڵم،

لە چوار وەرزی هەناسەدا

وڵاتی ژانو گریانە

لە چوار لاوە سنوورەکان

هاوکاری ئەبەستن

وەك دڵدارێ ،

چاوی ئەبڕێتە ئاسۆیەك و

لەسەر شەقامی بێدەنگی ،

کڕنوش ئەبا ،

بۆو زەریایەی درەختێکیان تێدا خنکاند .

بەڵام ئێستا

ڕەگەکانی ئەو درەختە پەڵەی داوە و

لەگەڵ هاژە و شەپۆلی ڕۆباردا ،

خۆ ئەخاتە

ناو باوەشی دارستانی هاوارەوە .

من دارستانم خۆش ئەوێ

دارستانی پڕ لە هاوا ر !

هاوارەکان

بێ تاوانن !

ئەرێ گیانە

ئەوا دیسان ، حەیرانە ، حەیرانە ، حەیران

حەیرانێکی تەمەن کوتم

دەستەکانم : دیجلە و فراتی ئاشقن

سەرچاوەکەی ئەندێشەمەو

لەحیاتی ئاو

خوێنی سووری تیا ئەگەڕێ و

هەموو شەوێ ، سەفەر ئەکەن بۆ عەرشی خوا .

ئێوارەیە و جێ ژوان چۆڵ .

نەباران ئەبارێ و نەماچ

نە گەڵا تەڕ ئەبێ نە لێوی تۆ

ئەرێ تۆ

تۆی خۆشەویست

ئەبێ بڕۆم , ئەم تەنیاییە بەجێ بێڵم .

ئەچمە شاری درەختەکان ، دەبمە چنار ؛

ئەمقرتێنن ؛

ئەڕۆمە سەر زەمینی ئاو ، دەبمە رۆبار ؛

پێشم ئەگرن ،

روو دەکەمە کەویری ویشك ، دەبمە هەتاو ؛

تیکشم ئەبڕن ،

ئەچمە نێو مرۆڤو خوا دەبمە هەوا ؛

یەخسیر ئەکرێم

لە نێوانی شێعر و شاعیر ، دەبمە وشە و....

تەقەیەك و دووان و سیان ئیتر تەواو ....

{ پەپوولەیەك باڵ لێ ئەدا بەرەو ئا سمان }

گەر بێمەوە و

بچمەوە ژوان

دائەبارێنم

بەسەر لێوی گەڵاکان و

دەبمە باران .....

10/29 /79 هەتاوی – بۆکان

لە ڕێگەی تازە پێ گرتوو ی بێ دابڕان
لە سەرەتایی بێ کۆتایی تا ئەو پەڕی گەیشتن بە ئەوین
هەتا تۆ ،
رازو نیاز لەگەڵ شەمشەمەکوێرەکانی بێ ئەشکەوت و
سوالکەرەکانی بێ شەقام ،
وێران بوونی ئیمپراتووری ئەندێشەم ـ بێ تاوان ـ
لە وەرزێکی سەوزی هەڵگەڕاو
بە زریانی داهاتوویەکی رەنگ پەریو لە مەڵبەندی کۆبوونەوە .

( 2 )

تا سەبارە ، دڵ
لەبۆگەن بوونی هەناسەی هاوڕێیان
لە ئێوارەی خوێن خنکاوی راوەستان دا
مەرگ ؛ دووایین مۆسیقای نا هومێدییە .
دەی گوێ گرن ئەی زیندەوەرانی بێ تەمەن
تەمەن ، پاییزێکی چەن مانگەیە
ویشك هەڵاتو ، لەناو جەغزی بێ بارانی چاوەڕوانی .
بڕوا مەکەن بە بەهار
بڕوا کردن سەرەتایەکی ناوەختە ،
ئەم شەقامە لە مێژ ساڵە دوچارێتی
رەنگ بزرکاون ، پیاوانی بێ یاسا و
ترسەنۆکتر لە ژنانی دۆزەخ نزیك
من ڕێگا ، لێتان ماندووین ،
ئەی بیرە کۆنەکانی ڕابردوو .

( 3 )

بمدوێنن ، ئەی شەوانی سپی و
ئەی رۆژانی ڕەش ، بمدوێنن
وا گەیشتین بە ئەستێرەی پێکەوە بوو ن زۆر نزیکە .
حەکایەتی دوڕگەیم لەناو دەریای نا ئاوامی بێدەنگی دا .
شەپۆڵ، شەپۆڵ دەهارووژێنم .
بەختەوەرییەکی شێتانە لە دەروونم دێت و دەچێ
بۆ پەیوەندی نێوان من و ئەو ڕێگایە .
} تێپەڕ بوونی ئامرازەکانی بێ ئاواتی لە مێژینەم {
ئەم ڕێگەیە ، تەجرەبەیە ، تەجرەبەیەکی ئەبەدی .
( بیرەوەری ئەم ڕۆژانەی لە تاریکی دا نوقم دەبن ، ئازارم دەدەن ) .

بیری تازەم .

پاییزێکی کۆچەرییە ،

بەردەوامە بۆ گەیشتن بە ئاما نجی کۆتایی رێ .

ژیان یانی : تەواو بوونی ئەم رێگەیە بێ دابڕان .

بەرەو شوێنی خۆشەویستی .

سەفەر یانی : بەرێوە بوون لەگەڵ هەنگاوە زەربەکان .

ئەوینێکی تازە ساوای لە دایك بوویە ؛ شێعر

بۆ دەربڕین و تەواو بوونی ئەم رێگەیە وا لەبەر مە .

ئا ا ا ا ای ...

ئەم رێگەیە گەر تەواو بێ ، منیش ئەبم بە باڵندە و

هەتا سنووری هەورەکان باڵ لێ ئەدەم .

( 4 )

لە بازاڕی بێ بازاڕی تەنیایی دا .

گەزیزەیەك خەڵات کراوی نەورۆز بوو

دەریا ئەگری لە تینوێتی بۆ ربارانی پێ گرتوو،

لە دارستانی بێ گەڵا

کۆبوونەوەی سەوزەکانە بەرانبەر یەك .

ئەمرۆ وشەی رەشایییە تەفسیر ئەکرێ ،

سبەی ئیتر دارستانیش ،

کەویرێکی بێ باوەشە ؛

باسی سەرما و ئاو وسەهۆڵ قەدەغەیە .

هەڵوەرینی ئاواتەکان

کاول بوونی مەملەکەتی منالێم تاکوو ئێستا

تێك شکانی مۆسیقای بیرو ئەندێشەم

موسیبەتێکی گەورەیە ،

بەپانایی چاوەکانی لێلی خودا .

( 5 )

بەرێوە بوون ؛ تەعبیری شۆرشێکە لە ئۆردووگای میهرەبانی .

من داخوازی تێکەڵ بوون پاڕانەوەم لە کیشوەری نەفرین کراو

حەیران بێژی بەستەیەکی بێ کۆتاییم

بۆ گەیشتن بە سێوی سووری ئاوات،

نەدامەتیم ، لە بەندیخانەی چاوی رێ دا یەخسیر بووە .

{ هەنار بە ئاوێنە و ئاوێنە بە هەنار دەبەخشم }

پرسە دەگرم بۆ دوایین تا بووتی بەڕێوەی ڕێگا .

( 6 )

ڕێگا : ساماڵێکی دلۆڤانە

بۆو مەلانەی هەڵفڕینیان لە بیر چووە

نامۆم مەکە ،

من ماندوو نیم .

من سەرەتای بەڕێوە بوونم لەبیرە

ئێستا وەرزی سەر هەڵدانی ئەندێشە یە

بە یارمەتی ئەندامانی بەڕیچوەبەر .

ئەمڕۆ ڕێگا ,

چاوەڕوانی هەنگاوتانە

سنەوبەرانی بەجێ ماو

لە مێژە چاوەڕوانی سڵاو مە ؛ مەرگ

هێور ، هێور ڕێ دەپێوم

بەرەو خودا .

دوایین سنوورە ، کۆتایی

(( مەرگ )) سڵاوم لێ دەکا .

بۆکان ـ 1380 هەتاوی

## تا باران ...

لەگەڵ سەما و هەناسە و چارەنووس ، تێکەڵاوە ...

بالاان .

لە دەروونی ئەشق و خەمدا

تا گەیشتن ،

هەر خەم بە دوای نیگای پڕ لە تینی داڕشتن و کۆچ و سەفەر ،

} نیگەرانتم {

ئێمە (( با )) بووین

بێ هیچ تاوانێکی سوور

چەندە ڕۆ چووین لە زەریای عەشق ،

مەرانە و ئازا .

ئەوین نامخنکێنێ – نا

کوا دەسەڵاتی تەڕ بوونم

لەبەر ڕێژنەی تاریکایی و منی سەرکەش .

مەست هەر منم
تا سەردەمی خۆش بوون و ئاوا بوون و
گوێ نەدان بە چاوە بارانییەکانی دایکم ،
ئاسمان , لە سەرەتا
سوور
سوور
تێکەڵی خەیاڵی ئەوینمە و
تەنیا دایکم نەخەوتووە و
تا بەیانی ،
سەر گەردانی خەونەکانی تۆیە (( باران )) !

ئەم گەشتە خەیاڵی خەواڵوو
چۆن دەکەی بە سەرین بۆ نوستن ؟
بە بۆنی باوەشی
ئەم هەورەی گریاوە ،
باریوم .
دڵۆپێك لە ئەشق و
دڵۆپێك لە سەما
هەر ماچە لە خەو و سەفەر وشێعردا
بی تام و بێ تەرە .
لە تۆوە
باران
ئەبارێم
( خۆزگەیەك ؛
وەکوو تۆ منیش ـ با ـ م ).

رەش ترین ئاسمانە و
گوڵەکەم
خوات لەگەڵ
نەبێ من !
ئەمانەجیاوازن لە شێعری سپی
لە ماچی ئەفسانە و
بێ گەردی و زوڵاڵی خەڵوەتێك .
دەبێ تۆ بمێی

له ترسا ، لەبەر شەرم

هەناسەت یا خییەو

من خەوتووم

لەنێوان ئەم شەوە بەیانیو

نەكا تۆش ،

ئەفسانەی ئێوارەی ئەم رۆژەی ...

خولیایی — تۆ !

باران مەمدە بە دەست ، دەستەكانی

خوێناویيە و

من ترساوم

له مردن و

له تەمەن و

له لێدان كەوتنی دڵ و چاو

پەپوولە بارانەو

بارانەو

پەپوولە تەڕ دەبن.

تا ئێستاش ،

بارانە تەشتەكە پڕ دەكا له گریان .

بێكەسی له خولیای ئاوێنە و ئێوارە دەمێنێ

منیش لەو دیوی سەفەرەوە بەرێوەم ،

دیوەكان ئەكووژم .

زەریایەك له رەشە چڵكنی پەپولە باران و

له من را

تا وەكوو ئاوا بوون

( چرکەیەك !

من نە ـ با ـ م )

زەوی , له من دا پێی گرت و

رۆبارەشێتەكان ،

هەنووكەش هەر ساوان .

ـ ( وشەكانت ،

لەهەرێمی دڵداریم بفرێنە ,

غەمگین ترم لەوەی ئەم شێعرستانە ,

دڵپرە )

ـ من ـ دەمێنم !

ئێستا بێ تۆ ئەچێژم ، چ ڕەنگە ؛

دایکم باریوە وەك گریان :

ئەشقەکەم ، بمێنێ .

تا سووتان چ تامە ؟

باوکیشم ،

ناوی خوای بەئا ستەم دەهێنێ

ترساوە لە نەچوون ،

تا بە هەشت گریاوە ،

تۆ باران

تەنیاییت ئەچۆڕێ و

خۆلاویترینی

لە نیگای ئاوێنە و

ئەسپێکی سەکەشی ، بە ڕەنگی خورئاوا

لە دەشتی شێعرێکی سپی ـ م دا .

من تێنووم

بەتینی ماچێکی لێوا لێو ،

تەڕم کە بە تیشکی هەتاوی ڕووی نیگات .

دامپۆشە بە هەورو تەم ومژ

پۆشراوی دەستی تۆم

تۆ باران !

گریانی ئاسمانی ئەوینی و

منیش تۆم باریوم

بە هەستی ناسکی شاعیرێك .

لێڵ ترین نوسراوەی شعووری شاعیر و

خولیایەکی وەنەوشەیی

من تەڕم بە ماچی گوڵە گەنم

کازیوە نزیکە

تا باران ...

بۆکان ـ 1380 هەتاوی

# ئەم جوغزە تەواو نابێ

هۆ غەربیە دڵ ناسکەکەی وڵاتی دوور
دوورتر لە هەناسەی ماندووی رێ
رێ نازانم ونم مەکە.

ونم مەکە ئەی تاقانە ترین ئەستێرەی ئاسمانی بوون ,

بوون :

چۆلەکەیەکی تەنیایە

تەنیاتر لە هەموو ساتەکانی ئێستای ژیان

ژیان ؛ بارانە و

کەسێك پڕ بی ناخی ساڵانی تەنیایی و تینوێتی پێدەکەنێ .

لە دوورترین شوێنی لە دایك بوونمەوە

تا ئێستای مەرگو من

بەرێوەم

نەماندوویی ئەم غوربەتە تەڕم دەکا ،

نە بارانی بێ پاییزی ئەم وڵاتە رێگە دەبڕێ .

ئای لە ژوانی هەرچی چۆلەکەو چنارە

بێزارە ( من )

لە (من ) ، لە( تۆ)

لە خولقانی ئەندێشەی ( ئەو )

لە شوێنێکی بێ کاتژمێر

لە ساتێکی بێ شوێنەوار

لە چوارڕێیانی سەر شەقامی کۆ بوونەوەی}خۆشم ویستی { .

لە رۆژنامەی دووکەڵ و

دابڕانی ئێوارانی ئاوابووندا .

لەگەڵ باران ئەڕۆمە سەر

لەناو زەیایی ئاسمانا نوقم ئەبم

هێور، هێور

لە نزیکیت دوور ئەبمەوە

ئای لە پێناسەی هەرچی دروشم و درۆیە بێزارە ( تۆ )

لە ( تۆ ) ، لە (من)

لە هەراسی هەرەسانی ( ئەو )

لە یاخی بوونی باران و پەپوولە

لەپەپوولە بارانی پاییزی پێکەوە بوون

لە خوێندنەوەی شێعرەکانی گوناه و

گەردەلوولی ئێوارانی { (( منت ئەوێ )) }

لە فڕینی بەفر بەرەو ژووری زەوی

له زستانی پێگەیشتن .

لەگەڵ شكۆفه دێمه خوار ،

لەناو ئاسمانی زەریادا باڵ لێ ئەدەم

بەره بەره

له دوورەوه نزك ئەبم.

ئای له بوونی هەرچی ( من ) و ( تۆ ) یه بێزاره ( ئەو )

له (من ) له ( تۆ )

له خوڵقانی ئەندێشەی هەراسی هەرەسانی ( خۆی )

له بەهاری بێ بڕوای باران و برووسكه

له جنێو دانی شاعیرێكی شێتی بێ شێعرۆ شەمامه .

له ژینۆسایدی هەورستانی ئەمجاره } (( ناتانبەخشم )) {

له خنكانی ماچ ۆ ماسی

لەدار دانی تەنیایی و تەناف

له هەمیشەی هەبوونی هەمووتان

هاوارێك ،

رەنگێك ،

ترسێك ،

به روومەتی مناڵانیمافی مرۆڤ

وەك پرسیاری سەدەی تازەی خۆزگه خەیاڵ ،

بێ وڵامه .

بۆكان – 1380/8/9 هەتاوی

# ئەم ژمارانەم خۆش ناوێ

من یەكم

دارێك ، دڵۆپێك ،

ئەستێرەیەك و

نازانم , سێدارە یەك

تەنیا ـ یەکم

یەکم ـ تەنیا

کومناڵ بووم ، نەمئەزانی باران چیە !

بەلاّم ئێستا ، من دلّۆپە بارانێکم

کە مناڵ بووم ، ماناى دایکم نەئەزانی !

ئێستا ئەڵێم : دایك بۆ من کانیاوێکە

کە مناڵ بووم ، وێستیان فێرى ژومارەم کەن

ـ تۆ بلّێ یەك !     وەکوو ((تۆ )) یەك.

ئەمجارە فێر بووم کە من یەکم .

وتیان رۆڵە خوداى گەورە تەنیا و یەکە .

} خۆزگە بە خۆم من چەند گەورەم {

ـ تۆ بلّێ : دوو     دوو وەکوو من !

من و تۆ ئێمە دوانین .

مناڵ ، مناڵ = خۆشەویستی کەمرەنگ دەبێ .

پیاو ، پیاو = بیر لە کوشتن دەکەنەوە .

چن ، چن = ئاى بابە چەند بێ رەحمی .

ئاى دایە گیان (( دوو)) م ,

خۆش ناوێ

ـ تۆ بلّێ:  سێ

(( گریانم هات بۆ سێ شەهید ، شەهید ، شەهید و

سێ دار ، دار , دار    ە ))

باوکم دەیوت و دەگریا ـ گریا ـ یا

کە مناڵ بووم ،

من ئەترسام لەو دارانەى ئەبوون بە سیان .

لە سێ تەقە ، تەقە ، تەقە و

ئاى دایە گیان (( سێ )) م ،

خۆش ناوێ .

ـ تۆ بلّێ : چوار

وەك چوار چرا ، چرا ، چرا ، چرا

ـ تۆ بلّێ : چوار

وەك چوار بەش ، بەش ،بەش ، بەش

ـ لەم لاو لەم لا ، (( یەك )) بەش دەکەین

دەیکەین بە چوار برا ـ برا ـ برا ـ برا
من نازانم ئای دایە گیان ،
چوار فێر نابم
نە دوو ، نەسێ ، نە چوار
هیچیانم خۆش ناوێ ـ نا

نە ئەگریم و
نە ئەترسم
باوکم دەترسێ و
دایکم دەگری .
من یەکم
نە ئەمهەوێ ببم بە دوو
نەئەمهەوێ ببم بە سێ
نە بە چوار و
نە پێنج و شەش .......
تەنیا ـ یەکم
خۆزگە هەموو مرۆڤان و
هەموو وڵات ...... !
ئای ژومارە یەك چەن پیرۆزی .
تەمەنم ،
هەموو ساڵێ (( یەك )) زیاد ئەبێ .
یەك بەهارو
یەك هاوین و
یەك پاییز و
یەك زستانی تر ئەبینم
رقم لە (( تۆ )) یە کە (( دوو )) ی
خۆزگە ئەتۆش ئەبووی بە (من ) ، ئەبووی بە (یەك )
( گەورە ) ئەبووی ، ئەبووی بە ( خوا )
( یەك ژومەی سەرەتایە )
ئای دایە گیان ،
گەر (( دوو )) باش با ، خوا دوو ئەبوو !
ئەی بۆ کەس دوو جاران نابێ لەدایك ؟
خۆزگە دایە تۆش یەك دەبووی
بابم (( دوو )) یە

ئاخ بابە گیان خۆشم ناوێی ، بمبوورە !

من ئەمهەویست ، (( چوار )) فێر نەبم

ئێستا لێرە

هەر (( چوار )) دەورم (( چوار )) دیوارە

من ئەمهەویست ، (( سێ )) فێر نەبم .

هەموو رۆژێ (( سێ )) کەس دێن و قامك ئەخەنە (( دوو )) چاوم

هەلا (( دوو )) دەبەستم دەبەستن و

هەر (( دوو )) لاقم دەسووتێنن ،

من ئەمهەویست (( دوو )) فێر نەبم .

ئای دایە گیان ؛

ئەم ژمارانەم خۆش ناوێ

هەر چوار دەورم چوار دیوارە و

دایکم ئەتسێ لە سێدارە و

ئەمن لە سێ .

ئاوا باوکم بۆ من دەگری و

من بۆ باوکم نە گریلوم

نە ئێستا نەلە رابردوو دا .

خوشکەکانم

براکانم

هەر کام (( یەکن )) خۆشم ئەوێن .

ئای بابە گیان ,

تۆ بلێی ((دوو )) نەبێ بە ((یەك ))

یەکم ، یەك

دارێك ،

دلۆپێك ،

دلۆپێك لە دەریای بێ ڕحمی باوکم

دا .

یەکم , یەك .

ئەستێرەیەك لە ئاسمانی چاوی دایکما .

من یەکم و

سێ پیاوی زل

بەرانبەرم

هەڵدەبەستن ،

سێدارەیەك .

# بەشێك لە شیعرێكی نەنووسراو

**هەر لێرەوە تا هەمیشە سەرم گێژە ,**

**ئینسان بوون بە ئیمان هێنانی خودایانی درۆ**

﴿ إنَّ الإنسانَ لِرَبِّهِ لَكَنود ]

**چیتان لە گیانی بێ سنووری من دەوێ ؟**

ئێوە!

﴿ بێ ئەوەی بڕواکەن ﴾ ، یاسای ژیانتان لە بیرچۆتەوە

ئێوە !

جەماعەتی بێ چەك و بێ ویژدان

لە خەرمانەی ئەم شەوە بێ بڕوایە ، ڕاست ڕاست سەر دەکەوم

ئا ئێوە , لە بیر بەرمەوە

ئێوە , خەیاڵی تازەتر ،

لەبەینی ژن و هەوەس چی دائەنێن ؟

دان بە جەرگت بگرە خاتوون

ئەوانە لەگەڵ شەقامی من و تۆ بێگانەن

﴿ ڕاستت دەوێ ﴾

هەنگاوەکامان هەڵدەبڕن .

ئێمە لەوانە نین , بڕوام پێ بکە .

ئەوان , سەر دەمێکە لەسەر شەقام هەناسەی مردن ئەکێشن

لە ماڵێکی بە ژمارە 113 ی سەر شەقام

بڕیارە کەسێك ببێتە ((ئوستوورە ))و

من نازانم

((پێ بکەنم

بگریم

یان هەڵێم ))

لەوانەی ئەو پیاوە یان ناخۆش دەوێ

لەوانەی لە پاڵ دارتێلەکان , باڵایان بەرز ئەکەن و

هەموو شەوێ جگەرەیەك بە مانگ دا ئەگیرسێنن

جگەرە و خولیای شین

ژوورێکی پڕ دووکەڵ , لە وێنەی پیاوێکی شەڕانی

شەڕی ساڵ !

شەڕی مانگ !

شەڕی ڕۆژ !

تۆ لە کامیان داون بووی , پەنجەرە کراوەکەی ڕوو لە گۆڕستانی ئازاد ؟

ئەزانم , ئەمانە گشتی بیانوون

بۆ ناوی شەقامەی وا بڕیارە – تۆ ببی بە ئوستوورە – لە بیر خۆتانی بەر نەوە ...

تکایە , هیچ دڵتان نەسووتێ !

سووتان لێرە گاڵتەیە .

بڕوام پێ بکەن , جگەرە کێشان لێرە مەحاڵە , مەحاڵ .

چاوم دەبەستم
لەبەینی پەنجەرە و تارمایی دا
بۆنی ڕێگا و نامۆیی لە شوێنێکی تازەوە
هێندێ کەس بەڕێوەن
ئەترسم , هەبوونتان , چەند جێگەی ئەم شەقامە بۆگەن کا .
ئەڕۆم
لە ژووری 113 دا , لەبەر چاوتان ون دەبم
هەوای دەروونم ساردە
دەستەکانم لە گیرفاندا , لە وانەیە گڕ بگرێ
خۆزگە – لێرە بایەی و – لێوێکت دائەگیرساند .
تکایە (( سێو )) ێك بخۆ و
وەرە ناو ئەم ژوورە 113 یە .
وا بڕیارە ((ئوستوورە )) ببێ بە ((من ))
باران بە هەڵکەوت ئەبارێ و
من ئێوەم لەسەر شەقام جێ هێشتووە و
ئەزانم
ئێوە لە تینوێتی دا ئەمرن .
﴾ هەر بە دووی کوچتان هەمیشە شیوەن و گریانمە ﴿

هەزار ساڵ لە ئاسمان ژیای
بەجنتای پڕ ئەستێرە و
ئێستا
لەنێوان شەقامێکی بێ ناودا
خەریکە خۆت لێ ون دەبێ
تا دووبارە ئاشق دەبمەوە , کوا دەرفەت ؟
دەبینم
دەبیستم
ئەی چۆن ئێوە لەبەر چاوم دەبنە (( خاك و خۆڵەمێش ))
هەموو ئێوارانی هەینی
کات ژمێر , لە نێوان (( پێنج و حەوت )) دا ئەوێستێ .
7 و 5 : وێنەکان دەکێشم
7 و 5 : بەفر ئەبارێ و تۆ چەترەکان دەبەستی .
من بە ڕووتی ,
ـ لە نێوان باران و با دا ـ کفنێك بۆ بەری خۆم دەدرووم .

**دراوسێکان , وشەکانت هەڕاج ئەکەن**
**تا ئەمشەو , لە خودا , نانی گەرم بخۆن و**
**بیر لە سبەی , لە شەقام و لە ئوستوورە ئەکەنەوە...**
**من بە تەنیایی پەنجەرە ,**
**ڕوو دەکەمە گۆڕستان و 57 جار ناوی خۆم دووپات دەکەمەوە .**
**57 جار دەمرم**
**57 جار خەو بە ((سێو )) دەبینم**
**بمبوورە خاتوون , بمبوورە**
**تۆ ئیزن بە من نادەی تاوێ لەگەڵ ئەم کێلانە بدوێم**
**ئای لە دەرسەکانم جێ ماوم**
**سبەی , مامۆستا بە پێکەنین پرسیار ئەکا :**
**ئەوانە هەموو گاڵتەیە ,**
**پێم بڵێ : (( ئوستوورە )) یانی چی ؟**
**هەر خێرا خۆم حەشار دەدەم**
**لە چاڵی چاوی ئەو کچەی لەسەر بێ ناوترین شەقام , شقارتە ئەفرۆشی و**
**هەرا دەکا : ئەتوانن بەم شقارتەیە خۆتان ئاگر دەن .**
**هەر لەبەر چاوم ون دەبی**
**تارۆژێك دووبارە دێیەوە سەر شەقام**
**دەوێستی و دەڕوانی ئەو ژمارە 113 یەو**
**تۆ دەزانی**
**کەسێك بڕیاری داوە ئەمشەو , پاش کۆچی دوایین ئەستێرە**
**ببێتە (( ئوستوورە )) و**
**من ئێستا بیر لە پرسیار ئەکەمەوە ...**
**هەورەکان لەوانەیە بخنکێن**
**لە بێ ئاوی و ئاوەدانی ئەو شەقامەی**
**واناوی نەچۆتە کامپیوتێر و**
**کەس ژمارە رەمزی نازانێ .**
**ـ من لەوانەیە لەتینۆیتی دا بمرم , تۆ شقارتەم پێ دەفرۆشی ؟**
**ـ خۆزگە قەرەباڵغ ترین شوێنی شەقامت لەبیر با .**
**ـ هیچ شوێنێك , تەنانەت بۆ دانیشتن نابێ .**
**وەرە با سواری ئەم قاڵبە شقارتەیە بین ، گەر بشزانین کێ بە ئاوی دا داوە**
**گرینگ نیە , ئەوەی کە مەبەستە تۆی (( خاتوون ))**
**تاوێك سەر هەڵێنە**
**ئەمشەو , ئەستێرە بارانە و پەپەلەکان لە خولیای سووتان**

هەر شێت و وێڵ
بە دەوری ئەم چرای چاردەیە ئەگەڕین.
هیچ نەماوە لە جانتام دا و
تۆ نازانی
زەوی دوورە و
ئێمە , مردووەکان لەناو دڵمان حەشار ئەدەین .
لێی دەگەڕێم با ئەو (( با )) یە بێت و بچێ
بە نێوان ئەو شەقامەی , هێشتا کەس ناوی نازانێ و
کەس چێ نابا , کچێك لەوێ ـ بە چلەی هاوین ـ شقارتە ئەفرۆشی .

شەو بە پاتایی ئەو شەقامە درێژە و
ئێمە هیچ کام ڕێگەی ئاسمان نازانین
خۆم لە ئاوێنەی ـ با ـ دا ئەبینم
تۆش بە تەنیا لە ژووری 13 دا نوێژە بارانە دەخوێنی
بڕوام پێ بکەن ,
زەوی لە ئێمە دوور بوو
دەنا ئینسان خۆی مەعجزەیە بۆ ئیمان بە خودا
ـ دەست هەگرم بە پیاو
زەوی هێشتا بۆنی کەلاك و مردووی تازەی لێوە دێ
زەوی هێشتا , نامۆیە , بۆ ئەوانەی ئەستێرە و ئەوین و تۆیان خۆش ئەوێ ((خاتوون ))
هێشتا نامۆیی بە ڕەنگی ئەو کات ژمێرە وە دیارە و
تۆ دەتزانی , دەمرم
بۆیە ئاوێتەی ئاگر بووی و
شەم لە ژێر باران هەڵ دەکەی.
دراوسێکان
بەرەو مانگ سەفەریان کرد
جانتایان پڕ بوو لە باران و
هێدی لە ((با )) ئەڕۆیشتن .
من ئیستاش وێنەی ئەو پیاوەم لە بیرە
بە دەستێك ((هەنار )) و بە دەستێك ((ئاوێنە )) ی ئەفرۆشت
لەو ساتەوە , هەموو شەوێ , لە خەودا هەنار دەشکێنم
ـ ئەرێ تۆ شوێنی ئاوێنەکان نازانی ؟
ـ چەندەم حەز لە بۆنی نانی گەرمە ...
هیچ نییە خاتوون

وەرە وێڵ بە , بێ ئەوەی کەس بزانێ ,

کات ژمێرەکانیان لە کار خست

تا ڕێبوارەکان , ساتی ئەو هەرێمە نەزانن

ـ من رقم لە بارانی دووکەڵ و

ئەی تۆ , لە کام خولیادا خەریکە ون دەبی .

ـ تۆ ئەستێرەکان بەش ناکەی !

ـ لێم گەڕێ بالا هەموو شەوێ بە حەسرەتی دەردو داخی خۆم بمرم .

ـ تۆ ڕۆژێ 57 جار , لەسەر شەقام درێژ دەبی

من چ بکەم ,

بەجێی پارە , هەر وشە شك دەبەم

منداڵ ـ مەرگ ـ برسی ـ ئوستوورە ـ ...

ئیتر نازانم , خۆت بەوانە

داهێنەری دێرێك بە پێی بژی

تا ئوستوورە ڕێگا دوورە و

من هێشتا سەرم گێژە

وەرە با لە نێوان ئەم شەقامە , چەترێك هەڵدەین

تۆزی

دەریای

لێ بیشتبێ...

بۆکان ـ زستانی 1380 هەتاوی

# سەفەر تا مانەوەیەکی تر

(( ئەم شێعرەم لە سەرەتای سەفەرێکی بێ گەڕانەوەدا نووسی ))

سوێند بە سەرەتای سەفەریچکی سەوز

بە قەترانیترین سروشتی ئەم باخە و

وێرانی ئیشارەیەك لە (( دەردی غوربەت )) و لە (( سۆزی هیجرەت ))

چۆڕ ، چۆڕ

ئەبارێم ،

بەسەر خولیا سەوزەکاندا

دابەش ئەبم

تێئەپەڕم

(( دڵ ڕەنگە بیَ بە ئاوو بە چاوا بکا عوبوور ))

ماتەمێك .

کە منیش هەر خۆمم خۆش ئەویَ و

ئاوێنە و پەنجەرە و

هیچ باخێك لە خەو دا نادێنم .

جیێم نابیَ

بۆوەی خۆم بە هورەکانا هەڵواسم

تا فڕین بەرەو نەهاتی بیَ قەراری خۆم و

دوور بوونەوە لێتان :

مەخابن !

هێشتا ڕووناکی لەو دیوی باخەکە

هێشتا ڕووناکی لەو دیوی باخەکە

کە هێشتا پەنجەرەکان تەڕن بە هەناسە و بە ماچ و بە ماتیك

هێشتا ڕووناکی لەو دیوی باخەکە

ماوە هێشتا ,

هیچ شۆڕبییەك ڕاپۆرتی لێرە نەداوە

باخەوانیش ، لە ژێر سێبەری هەورەکانا

خەو بە درەختێکی پیرەوە دەبینیَ

چاوەڕوانی لە نیگایدا .

( باخەوان شەوانە، پاسەوانی (( سێو )) ە کانە )

هێندی بە ناخی تاریکی ڕۆ چووکم

تا هیچ چۆلەکەیەك نابینم

تا خۆم تارسك ئەبـــمو

تا خۆم لیَ ون ئەبیَو

تا خۆم لیَ ون

تا خۆم لیَ

تا خۆم

تا

......

تروكان ، ترووكان

تا سەرانسەری هەموو لەشت دەپشکنم

بە جریوەیەك لە هەناسەی بەرێوەی چۆلەکە و

ماتەمێکی خەست لە هێلّنجی دوایین چنار

قەت بوونەوە بۆ بەرە و خوداو

ئاسمانیچك بۆ گەورە بوون

دوو دلێن

لە حەقیقەتی ئەم جادەیەو

جیهان هێشتا لە بڕوامان دا ناگونجێ

تەواوی ئەم جادەیە بۆنی سەفەری لێدێ و دەدەکەڵ .

جیهانیش

((نا )) یەکی لەگەڵ تا کۆتایی و من نیگەرانی چیم (( وەی سواری لە من بە تەنێ ))

} چەن ڕێبواری هەرگیز نەدیوە ؛ لەو دیوی باخەکە ،

لەسەر جادەیەکی ئەبەدی ، بە زوبانی (( هەنار )) لەگەڵ یەك دەدوێن

هەناری ( 1 )

دانە دانە  چاوەکانم گەورە بوونی ئەو ڕەشاییەیەو

تەواو بوونی ئەم جادەیە لەبیر دەکەن ، ژانێك لە دەروون دا

خەریکە دەمقەڵەشێنێ

هەناری (2)

سوور ، سوورتر لە خوێنی سەر بڕاویئەم زەوییە وا هێشتا شێتانە

ئەشقی ئاسمانی بە خۆیەوە هەڵواسیوە ، کوا باران ...؟

هەناری ( 3)

من مەملەکەتێکم کە شکان ڕەهام دەکا بۆ بە ئێرە گەیشتنی :

- وست بن — (( خۆم لە پولسەکان خۆشتر دەوێ ! ))
- شەو }بەسەر هاتی ڕەشی خۆی بۆ هیچ کەس باس ناکا {
- تەنانەت ئەوانەی ڕێگەی خۆرە تاو نازانن
- قەت نەمیون ، نەمناسیون .
- لە شەلاڵی ئاگرێکە هەڵدەقولێن
- بۆ گەورە بوون لە سات و لە شەقام و
- منێك و تۆیەك و
- هیچ شوێنێك بۆ ئاشق بوون نابێ .

تا ئێمە ـ هەمیشە ـ خۆمان لە ئامێزی

حەقیقەتی باخ دا ببینین

تەماشە كەن پڕاوپڕ هەورەبانی

تارمایی یە ئەرژێ بە سەرمان

لەشمان تاریكترین جەهەننەمی خوایە

پەنجەرەیەك نابینی

شیشەكان ئالوودە نەبن بە گوناه

گوناهێك كە ـ تەنیا ـ بەمەستی

ئەتوتنم بە ڕاستی بیاندركێنم

ئەم باخە شەرابییە

پێخەفی باڵندەكانە یا ولآتێك , بۆ

وێران بوونی رۆحی شەكەتی من

وێرانم -

لە هەمیشەیی بێ ڕەنگ بوونی ئەم

باخە و

تەنیایی.

تا ترسی (( گەلآ )) لە (( با )) و

(( باران )) لە (( چەتر )) و

(( من )) لە (( هەناسەی ئەوانەی

فڕین بە گاڵتە دەزانین ))

{ حەزم لە گۆرانییەكی (( زیرەك ))

ئەكرد ، رە دوو كەوت }

هەر لەبەر ئەوانە ـ بە خوا ـ وێرانم .

بە باڵآی قامەتی چنار و

( تۆ )

ئەرخەوانیترین شكۆفەی ئەو

باخە پاییز زەرد هەڵگەڕاوەی

.

لە غوبەتی گەلآیەكەوە -

دەست پێ دەكا

تا مەست دەبێ بە بۆنی -

(( گێلاس )) ۆ

خۆت لەناو كانيلەيەكی -

مان گرتووە دا دەبينی و

دەڵێی :

/ من لە دايك بووی -

وەرزەكم كە (( باران ))

تيا مرد /

( چنارێك بە نهێنی ، چەن چۆلەكە فێری -

هەڵفرين دەكا

پاييزەو -

رژانەو -

هيچ جێيەك , تازە بۆوە -

نابێ خۆت فريو دەی

بە بەهارو -

بە كشۆفەو -

بەئەرخەوان ، -

هيچ ئاسمانێك ئەم -

ماتەمە قەبووڵ ناكا

هيچ گەڵايەك تازە -

نابێتە پايتەختی

سەوزايی و

هيچ وەرزێك نا بێتەوە -

پاييز

( پاييز ، هێدی هێدی -

خەريكە باڵا دەكا )

پەيدا ئەبم -

بە نێوان دارستانی -

دابەشكراوی رۆحی باخ

هەناسەی لێكپچراوی -

جادەو

تا ياخی بوونێك بەرو -

خودا پەواز ئەكەم

پەراز , تا نەهايەتی -

گەيشتن

لە خۆم -

له تۆ -

له هەمووتان -

دابڕان و -

-

دابڕان و

دابڕان .

بۆكان –

25/ 1381/1 هەتاوی .

## سەرەتای بوون ......

گەردەلوولی ئێوارەیەك وە

خەبەر دێم

جانتام پڕە له باران و

هەنگاو, هەنگاو تێدەفكرم .

نیگام پڕە له گورانی

دلۆپ , دلۆپ ئاشق دەبم

دڵم زیندانی تاوانه

سلاو ، سلاو رزگار دەبم

تەمەن رێگایەكی دوورەو

لەسەرەتای ئێوارەیەك ,

هەتا ئەمرۆ

هەزار هەنگاو ,

هەزار دلۆپ ،

هەزار سلاو

رێ دەپێون , بەرەو هەتاو .

## نامۆ ...

رەقاو رەق ((توورەییم )) بەش ئەكەم

بەخاك و بە باران

من خاكم خۆش دەوێ ، بە باران

بارانم خۆش دەوێ ، بەم خاكه .

ئەگەر خاك توورە بێ ، بارانیش دەسووتێ .
گەر باران توورە بێ , ئەم خاكە دەخنكێ .
پشتاو پشت (( ئەوینم )) بەش ئەكەم ،
به خوا و بەشەیتان
من خوام خۆش دەوێ، بە خوا
شەیتانم خۆش دەوێ ، بە شەیتان
ئەگەر خوا ئاشق بێ ، (( توورەیی )) نامێنێ
گەر شەیتان ئاشق بێ ، ئیتر هیچ ...
بابم : توورەیی
دایكم : ئەوینە
ئێستاكەش نازانم
نە خاكم ، نەشەیتان ، نە خوام ، نەباران

## نان و شێعر

**بۆ (( شاملوو )) و هەموو منالآنی جیهان**

خەمی شێعر بخۆم ،
یا
نان بنووسم ؟
خەمینە زگ ,
برسییە دڵ
لەبۆ لەتێك (( شێعری گەرم ))
یان لاپەرەی ((نانی دراو ))
(( ★ چ ها هسەم پێیە بیلێم ))
شێعر دەڵێ :
(( ئەگەر خەمی نان لێم گەرێ ★ ))
★ شاملوو

(( ... ... ))
تا بوونی خەمی شەوە زەنگ
تا سروشتی سەوزەترین چنار
تا هەزار سەدوی باران و
خەو نووچەكەی تەری ئێواران
بوونم بە هەناسەیەك پێویستە
تا شێعرێك ,

به ديواری مێشكتانه‌وه  ئه‌نووسم .

تاران 1/8 / 80

## نامه ...

سلاوێك

خه‌وڵه‌تر له نازی نیگاكه‌ت

من دوێنێ و رابردووی شێواوی یاخی بووت

ئه‌كه‌مه په‌پووله پاییزه

كه ئه‌مرۆ , ماچی تۆ ؛

شكووفه‌ی به‌هاره‌و

یادی تۆ ، ئاسمانی سه‌ره‌وه

شینتره له‌ئه‌شق و له باران .

تۆ نیازی دڵداری ،

ئه‌گه‌ر وا نه‌بوایه

كه بۆنی هه‌ناسه‌ت له‌شه‌قام نه‌ده‌ما

ده‌رفه‌تێك هه‌تا ( تۆ ) نه‌ماوه

خوات له‌گه‌ڵ

1380/6/11

## شێعرێكی بێ ناو

### بۆ هاورێی شاعیرم : یه‌حیا

لێره‌وه تا سه‌رده‌می شكۆفه دانی هه‌ناسه‌و

چرۆ دانی وشه‌كانت ،

پرن له من .

نوسراوه‌یه‌ك

له هه‌زاره‌ی سه‌ده‌كانی یاخی بوون و

ته‌نیایی خۆت ، ده‌فته‌رێك

( تۆ )

پیرۆزترین مانای

له مابه‌ینی منو شێعر

كه بوون ، كه هه‌ناسه‌ت

تا رێبواری هه‌تا ئاسۆ ، ماندووی رێتم .

ئه‌ی بێده‌نگترین هاوار : من

هه‌ڵئه‌نیشێم له‌سه‌ر چیای وته‌كانت

تا رەشاییەکانی هۆنراوەی روون ، رۆ دەچم بە ناخی دووپاتە بوونی تەتیایی

من ، ئەتۆ خودایانی پیرۆز

سەر خۆشی بادەیەکی شێعراوین

(( 17پیرۆز))

(( بۆ ئاشنایەکی دوور و لە دڵ نزیك ))

ئەمرۆ رووناکترین حەڤدەیە

حەڤدەی خەرمانانی هەبوون

لێتان پیرۆز

ئێوە ، خەمەکانی تەنیاترین ژن .

ئێوە ، بێ رەحمەترین وشەی ژیان ، پیاو .

لێتان پیرۆز

کە ئەمرۆ

ئەستێرەیەك (( فری بە باڵی سەوزو سوورەوە )) ★

کە ئەمرۆ ،

چیان وردە وردە ئەبێتەوە لەسات .

قرچە قرچی لە دایك بوونی هاوارە ,

لێتان پیرۆز

حەڤدەی خەرمانانی هەبوون

---

## وێنە ...

غەریبە ئاشناکەی —

دانیشتووی وڵاتی خەم ،

( تۆ )

ئاشنای غەریبی

هەمیشەی راوەستانی خۆم

( من )

غەریبتر لە ئاشنای دوێنێ و

ئاشناتر لە غەریبی ئەمرۆ و سبەینێ و داهاتوویەکی نەدیو

( ئێمه )

80/10/15

## چرکەیەك تەنیایی

خەونووچکە ئەمباتەوە

تا ماچ

تا بەرێوە بونێکی دووبارە لە خۆمو

لە هیچ .

لە ساتێکی بێچرکەو چرا

تەنیا بوونەوە بە نیگای شیرینترین سڵاو

...

شەو لە تاریکی و تارمایی دا نوقم

ماچ لە نێوان لێوەکانی ڕابردوو دا ، ون

ئاوێتە بوونی ئەوینێکی ڕەش ڕەش لە پرسیار

لە سوور بونەوەیەکی نوێ ,

ئەمجارە سوور .

كە شەو

ئەرژێتە نێو نیگای باڵندەی زەمانو

ژوان و هیچ بۆنێك

باران و هیچ هەورێك

شك نابەم

بۆ لە خۆم رزگار بوونێك و

لە تۆش .

لە پرِدا بەناخی شەوو رەش

- كە من مەست لە شێعر و

ماچ و لە باران –

ئەچمەوە .

ئیتر هیچ چركەیەك , مەودایەك

بۆ یاری لەگەڵ خۆت

لەگەڵ تۆ

ئیتر هیچ ......

بە شەوی بێ ساتدا ئەچمە سەر

هەتا خەو

- رەش دەبم بە ماچی

ئەمجارە ی لێوی سوور –

نیگایەك

بەپەیتا

بەرژێتە ناو چاوی بێ چركە

مەست بونێك تەجرەبە

بە شێعرو بە ماچو بە باران .

ئیتر هیچ مانایەك

بێ مانا

لە هیچ و لە خۆم و

لە بەرێوە بنێكی دووبارە

تا ماچی خەونووچكە

من و خۆم

خۆم و هیچ لە شێعر .

سێ چركە ...

(1)

له ساتی بەفرو ماچ

دڵتەنگی نووسراوەی شەوێکی بێ تۆ بوون

تا خەوی ئەمجارەی تەنیایی و

سێبەری خەوێکی دووبارەی

سەوز بوون

بەئەشقی تاریکی دەبەخشم

تا هەتا هەمیشە رزگاری ,

قاقا مەست بە گریان .

من وتۆ

نا هەرگیز ,

خولیایی نا بە خشین .

(2 )

له شەوی خەیاڵ و

خولیا بوون بە خەیاڵ

بێ کات و بێ چرای تەنیایی

ئاواتێك له دەروون

تازە بوون .

بە خەیاڵ شەوێکی خولیایی

تا منیش ئاوا بم له شێعری ئەمڕۆ دا

ئەمڕۆی کات

بە چرای دەروون و

ئاواتێك

خولیای شەو له خەیاڵ

منیش مەست بەشێعر

ئەمجارە ...

(3)

له چوار چێوەی بوون دا

تا له خۆبوونێك

من پرستن , هەر خولیایە و ئیتر هیچ

ئەهریەنێك له باوەش خۆم دا ئەکووژم

تا ئێوە

تۆ،

من ، مێهرەبان بین .

} خۆزگە بەو شەوەی وشە

لە دایك بوونی خۆی کرد بە ئایەت {

لە تەمەننای ئەمجارەی خۆم دا ئەمرم

تا پێغەمبەرێکی تر ،

بە خودا ئەناسێنم .

سنە – 1380/11/18